# كتاب

# أحكام العيدين

نووسینی :

لإمام أبي بكر جعفر بن محمد الفريابي

(٢٠٧ - ٣٠١هـ)

وەرگێڕانی : أبو عبدالله

پێداچوونەوەی : هلال عبدالله عمر

## كتێبەکە بە عەرەبی :

https://t.me/Ktebxanay_salaf1/489

## دوو تێبینی :

یەکەم : ئەو کتێبە عەرەبیەی کە دانراوە لەڕووی ڕیزبەندی ژمارەوە هەندێک هەڵەی تێدایە، لەم وەرگێڕانەدا چاک کراوە .

دووەم : بەشێک لە فەرموودە و ئەثەرەکان دووبارەیە، نووسەر هەمان فەرموودە و ئەثەری بە سەنەدی جیاواز هێناوە .

لە دوعای خێر بێبەشمان مەکەن، بارک الله فینا و فیکم .

# باب : (١)

## دەربارەی ئەوەی ڕیوایەتکراوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ

## کەوا ناوی ناوە لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان بە دوو ڕۆژی جەژن



١ - لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رضي الله عنه : کەوا فەرموویەتی : خەڵکی مەدینە لە جاهیلیەت دوو ڕۆژیان هەبوو لە هەموو ساڵێك کە ئاهەنگیان تێدا دەگێڕا و یاریان دەکرد، جا کاتێك پێغەمبەر ﷺ هاتە مەدینە : فەرمووی : (دوو ڕۆژتان هەبوو لە هەموو ساڵێك کە یاریتان تێدا دەکرد، بەڵام الله عزَّوَجَل بۆی گۆڕیون بە باشتر لەوانە : ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان، وە جەژنی قوربان) .

٢ - وە لە عبداللهی کوڕی عەمری کوڕی عاص ەوە رضي الله عنهما، کەوا پێغەمبەر ﷺ بە پیاوێکی فەرموو : (فەرمانم پێکراوە ڕۆژی قوربانی بکەم بە جەژن، الله گێڕاویەتی بە جەژن بۆ ئەو ئوممەتە) .

جا پیاوەکە ووتی : ئەی ئەگەر هیچم دەست نەکەوت جگە لە منیحە کورەکەم ، قوربانی پێبکەم؟

فەرمووی : (نەخێر، بەڵام لە مووت دەگریت [سەرت دەتاشی واللە اعلم]، وە نینۆکەکانت دەکەی، وە بەرت دەتاشی، وە سمێڵت کورت دەکەیەوە، ئائەوە تەواوی قوربانییەکەتە) .

٣ - وە لە عبداللّەی کوڕی عمرەوە رضي اللّه عنهما : (کەوا پێغەمبەر ﷺ و أبو بکر و عمر نوێژی دوو جەژنەکەیان دەکرد لە پێش ووتاردان) .

٤ - وە لە عبد اللّەی کوڕی عباسەوە رضي اللّه عنهما : (کەوا پێغەمبەر ﷺ نوێژی جەژنی بۆ کردن لەلای ماڵی کثیری کوڕی الصلت) .

٥ - وە لە جابرەوە رضي اللّه عنه فەرمووی : (پێغەمبەرم ﷺ بینی لە ڕۆژی جەژن جا دەستی کرد بە نوێژ پێش ووتاردان) .

٦ - وە لە عبد اللّەی کوڕی عباسەوە رضي اللّه عنهما فەرمووی : (ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، وە لەگەڵ أبو بکر و عمر رضي اللّه عنهما جا دەستیان دەکرد بە نوێژ پێش ووتاردان) .

٧ - وه له ابي عبيدهوه مهولاى عبد الرحمن كورِى عوف، وفهرمووى : (ئامادهبووم لهگهڵ عمر رضي الله عنه له ڕۆژى جهژنى قورباندا جا دهستى كرد به نوێژ پێش ووتاردان، پاشان فهرمووى : بيستم رسول الله ﷺ : (ڕێگرى دهكرد له بهڕۆژوو بوونى ئهو دوو ڕۆژه، ئهمما ڕۆژى جهژنى ڕەمەزان، ئهوا ڕۆژوو شكاندنتانه له ڕۆژووهكانتان وه جهژنيشه بۆ مسوڵمانان) .

عبد الرحمن ى كورِى عوف فهرمووى : (پاشان ئامادهبووم لهگهڵ عثمان رضي الله عنه له نوێژى جهژنى ڕەمەزان له ڕۆژى جومعهدا دهستى كرد به نوێژ پێش ووتاردان، جا فهرمووى : بهڕاستى ئهو دوو جهژنه كۆبوونهتهوه له يهك ڕۆژدا) .

٨ - وه له ابي عبيدهوه ووتى : (ئامادهى جهژن بووم لهگهڵ عثمانى كورِى عفان رضي الله عنه جا دهستى كرد به نوێژ پێش ووتاردان، وه فهرمووى : بهڕاستى ئهوه ڕۆژێكه دوو جهژن تێيدا كۆبووهتهوه جا ئهوهى لێره له خهڵكى عواليه مۆڵهتى ههيه، وه ئهوهى پێى خۆشه بمێنێتهوه با بمێنێتهوه) .

---

: (ئهوه ڕۆژێكه دوو جهژن تێيدا كۆبووهتهوه) واته ههم ڕۆژى جومعهيه، وه ههم جهژنى ڕەمەزانه يان قوربان .

وه (ئەوەی لێرە لە خەڵكی عواليه مۆڵەتی هەيە) و اتە ئەوەی خەڵكی شوێنێكی دوورە ئەوە مۆڵەتی هەيە تەنها نوێژی جەژنەكە بە كۆمەڵ بكات و دو اتر برِو اتەوە بۆ ماڵ و ئامادەی وتارەكە نەبێت، والله أعلم .

**٩** - وە لە حسن ەوە رحمه الله وتی : (دوو جەژن كۆبوويەوە لەسەردەمی خەلافەتی ئيمامی علي رضي الله عنه، جا نوێژێكيانی كرد و ئەوی تری نەكرد) .

---

: و اتە نوێژێكی بە جەماعەت كرد لە مزگەوت، وە ئەوەی تريانی بە جەماعەت نەكرد، لەوكاتەدا تەنها لە يەک مزگەوتی گەورە نوێژی جومعە و جەژن كراوە، ئەبوو ايە خەڵكی لە هەموو شوێنێكی شارەكەوە ڕوويان بكردايەتە ئەو مزگەوتە، جا قورسە لەسەر خەڵكی لە ڕۆژێكدا كە هەم جەژن و هەم جومعەيە دووجار برِۆنە مزگەوت و بگەڕێنەوە بۆ ماڵ، والله أعلم .

**١٠** - وە لە عبد اللهی كوڕی سائيب ەوە رضي الله عنه ووتی : ئامادەی جەژن بووم لەگەڵ رسول الله ﷺ جا نوێژی جەژنی بۆ كردين، پاشان فەرمووی : (بێگومان نوێژەكەمان كرد، جا ئەوەی پێی خۆشە دابنيشێت بۆ ووتارەكە با دابنيشێت وە ئەوەی پێی خۆشە بروات با بروات) .

١١ - وه له عقبه‌ی كوڕی عامری جوهه‌نیه‌وه رضي الله عنه ووتی : رسول الله ﷺ فه‌رمووی : (به‌ڕاستی ڕۆژی عه‌ره‌فه، وه ڕۆژی جه‌ژنی قوربان، وه ئه‌یام التشريق [ڕۆژی دووه‌م و سێیه‌م و چواره‌می جه‌ژنی قوربان] جه‌ژنی ئێمه‌یه ئه‌هلی ئیسلام، وه ئه‌وه ڕۆژی خواردن و خواردنه‌وه‌یه) .

١٢ - وه له عقبه‌ی كوڕی عامره‌وه رضي الله عنه ووتی : رسول الله ﷺ فه‌رمووی : (به‌ڕاستی ڕۆژی عه‌ره‌فه، وه ڕۆژی جه‌ژنی قوربان، وه ئه‌یام التشريق [ڕۆژی دووه‌م و سێیه‌م و چواره‌می جه‌ژنی قوربان] جه‌ژنی ئێمه‌یه ئه‌هلی ئیسلام، وه ئه‌وه ڕۆژی خواردن و خواردنه‌وه‌یه) .

## باب : (٢)

## دەربارەی ئەوەی ڕیوایەتکراوە لەبارەی خۆشۆردن بۆ ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان



**١٣** - لە نافعەوە، کە وا : (عبد الله ی کوڕی عمر رضي الله عنهما ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان خۆی دەشۆرد پێش ئەوەی بچێت بۆ مزگەوت) .

**١٤** - لە نافعەوە کە وا (عبد اللهی کوڕی عمر رضي الله عنهما خۆی دەشۆرد بۆ دوو جەژنەکە، وە دەردەچوو بۆ مزگەوت پێش ئەوەی خواردن بخوات) .

**١٥** - لە جعدی کوڕی عبد الرحمن ەوە ووتی : (سائبی کوڕی یزیدم بینی خۆی دەشۆرد پێش ئەوەی دەربچێت بۆ نوێژگە) .

**١٦** - لە نافعەوە کە وا (عبد اللهی کوڕی عمر رضي الله عنهما خۆی دەشۆرد و بۆنی خۆشی لەخۆی دەدا ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان) .

١٧ - له سعیدی کوڕی المسیب ەوە رحمه الله کە وا دەڵێت : (سوننەتی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان سێ شتە : ڕۆیشتن بۆ نوێژگە، وە خواردن پێش دەرچوون، وە خۆشۆردن) .

## بابی : (٣)

## دەربارەی ئەوەی ڕیوایەتکراوە لەبارەی خواردنی شتێك پێش دەرچوون بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان



**١٨** - لە سعیدی کوڕی المسیب ـەوە رحمە اللە ووتی : (مسوڵمانان خواردنیان دەخوارد لە پێش نوێژی جەژنی ڕەمەزان، وە ئاوایان نەدەکرد لە ڕۆژی جەژنی قوربان) .

**١٩** - وە لە سعیدی کوڕی المسیب ـەوە رحمە اللە ووتی : (دەرمەچن بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان هەتاوەکو شتێك دەخۆن، وە ڕۆژی جەژنی قوربان خواردن مەخۆن هەتاوەکو قوربانیەکانتان سەردەبڕن) .

**٢٠** - وە لە نافعەوە کە وا (عبد اللّهی کوڕی عمر رضي الله عنهما نەیدەخوارد و نەیدەخواردەوە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان هەتاوەکو دەردەچوو بۆ نوێژگە وە واجب نییە لەسەر خەڵکی) .

٢١ - وە لە هیشامی کوڕی عوروە وە رحمهما الله، لە باوکیەوە کە وا (خواردنی دەخوارد لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان پێش ئەوەی دەربچێت) .

٢٢ - وە لە سەعیدی کوڕی المسیب ـەوە رحمه الله ووتی : (کە وا خەڵکی فەرمانیان پێدەکرا بە خواردن پێش دەرچوون بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان) .

٢٣ - وە لە ئیمامی مالیك ـەوە رحمه الله ووتی : (خەڵکی فەرمانیان پێدەکرا بەوەی خواردن بخۆن پێش ئەوەی دەربچن بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان، وە لەسەر ئەوە گەیشتم بە خەڵکی) .

## بابى : (٤)

## دەربارەی ئەوەی ڕیوایەتکراوە کە وا لە سوننەتە بە پێ ڕۆشتن بۆ نوێژی دوو جەژنەکە

**٢٤** - وە لە سەعیدی کوڕی المسیب ەوە رحمە اللە کەوا ووتی : (سوننەتی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان سێ شتە : ڕۆیشتن بۆ نوێژگە، وە خواردن پێش دەرچوون، وە خۆشۆردن) .

**٢٥** - وە لە الزوهري ەوە رحمە اللە ووتی : (کەوا رسول اللە ﷺ سواری هیچ ئاژەڵێك نەدەبوو بۆ شوێنکەوتنی جەنازە، وە نە لە دەرچوونی بۆ نوێژی جەژنی قوربان و ڕەمەزان) .

## بابى : (٥)

## دەربارەی کاتی دەرچوون بۆ دوو جەژنەکە



**٢٦** - لە محمدی کوڕی زیادەوە ووتی : (أبا أُمامة باهليم رضي الله عنه بینی وە پیاوانێك لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ ئەگەر نوێژی بەیانیان کردبا لە دوو جەژنەکە بە جەماعەت و ئیمام سەلامی بداباوە، پەلەیان دەکرد لە دەرچوون بۆ ئەوەی دابنیشن لە نزیك مینبەرەکە) .

**٢٧** - وە لە یزیدی کوڕی ئەبو عبیدەوە ووتی : (نوێژی بەیانیم کرد لەگەڵ سَلَمة بن أكوع رضي الله عنه لە مزگەوتی رسول الله ﷺ، پاشان دەرچوو و منیش دەرچووم لەگەڵی هەتاوەکو گەیشتینە نوێژگە جا دانیشت منیش دانیشتم لەگەڵی هەتاوەکو ئیمام هات) .

**٢٨** - وە لە مالیك ەوە پێی گەیشتووە کە وا (سعیدی کوڕی المسیب دەردەچوو بۆ نوێژگە دوای ئەوەی نوێژی بەیانی دەکرد) .

**٢٩** - وه له ئيمامى ماليك ـهوه ووتى : (سوننهت وا ڕۆيشتووه لاى ئێمه لهكاتى نوێژى جهژنى ڕهمهزان و قوربان كهوا ئيمام دهردهچێت له ماڵهكهى به ئهندازهى ئهوهى دهگاته نوێژگه و كاتى نوێژهكه هاتووه) .

---

**: نوێژى جهژن كاتێك دهست پێدهكات كه ڕۆژ به ئهندازهى ڕمێك بهرز ببێتهوه جا ئهوكاته سوننهته ئيمام له ماڵهكهى بێته دهرهوه بۆ نوێژگه، وه نوێژگه (المصلى) ئهو شوێنهيه كه سوننهته ههموو موسوڵمانان له دهرهوهى شار تێيدا كۆببنهوه و نوێژ بكهن پێكهوه .**

**٣٠** - وه له ليث ـهوه ووتى : (پرسيار كرا له ڕهبيعه لهبارهى كاتى نوێژى جهژنى ڕهمهزان و قوربان، ڕهبيعه ووتى : ئهگهر ڕۆژ ههڵات ئهوا پهلهكردن تێياندا باشتره له دواخستنيان) .

**٣١** - وه له زوهرييهوه ووتى : (ئهوان **[هاوهڵان و تابيعين]** نوێژى دوو جهژنهكهيان دوادهخست ههتاوهكو ڕۆژ ههڵدههات به تهواوى) .

**٣٢** - وه له يزيدى كوڕى ئهبو عبيدهوه ووتى : (دهرچووم بۆ ئهوهى هاوهڵيهتى سَلَمة بن أكوع بكهم رضي الله عنه له ڕۆژى جهژن جا ئامادهى

نوێژی بەیانی بوو لەگەڵ ئیمام لە مزگەوتی رسول الله ﷺ، پاشان دەرچووین بۆ نوێژگە) .

**٣٢** - وە لە یزیدی کوڕی خمیری الرحبيّ کەوا (عبد اللهی کوڕی بسر رضي الله عنه دەرچوو لەگەڵ خەڵکی لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان یان قوربان، جا ئینکاری هێواشی و لەسەرخۆیی ئیمامی کرد و فەرمووی : ئێمە لێدەبووینەوە لە نوێژەکەمان لەو کاتەی ئێستاماندا، وە ئەوکاتە کاتی تەسبیحات بوو) .

## بابی : (٦)

## دەربارەی ئەو کەسەی تەکبیرات دەکات لە ڕۆژی جەژندا کاتێك دەردەچێ بۆ نوێژگە لە ڕێگادا، وە کاتێ بە ئیمام دەگات



**٣٤** - وە لە ئیمامی عمری کوڕی عبد العزیز ـەوە ووتی : (کـە وا تەکبیراتی دەکرد بە دەرچوونی بۆ ووتار و نوێژ تاوەکو نوێژ دەکات لە پێش هەردووکیانەوە) .

## بابی : (٧)

## دەربارەی ئەوەی تەكبیرات دەكات لە ڕۆژی جەژن ئەگەر دەرچێت بۆ نوێژگە لە ڕێگادا، وە كاتێ بە ئیمام دەگات



**٣٥** - لە نافع ەوە، لە عبد اللهی كوڕی عمر ەوە رضي الله عنهما كەوا (ئەو تەكبیراتی دەكرد ئەگەر دەرچووبا بۆ نوێژگە لە ڕۆژی جەژندا) .

**٣٦** - لە عبد العزیزی كوڕی یحیي ەوە ووتی : (پرسیارم كرد لە عبد اللهی كوڕی نافع، مالیك چۆن تەكبیراتی دەكرد؟

ووتی : مالیك تەكبیراتی دەكرد كاتێك بهاتبا بۆ نوێژگە هەتاوەكو ئیمام دەهات) .

**٣٧** - وە لە ولید ەوە ووتی : (پرسیارم كرد لە ئیمامی ئەوزاعی و مالیكی كوڕی ئەنەس لە تەكبیرات كردن بە ئاشكرا لە دوو جەژنەكە، ووتیان : بەڵێ، عبداللهی كوڕی عمر تەكبیراتی بە دەنگی بەرز دەكرد هەتاوەكو ئیمام دەردەچوو بۆ نوێژ) .

**٣٨** - وە لە زوهری ەوە ووتی : (تەكبیرات بە دەنگی بەرز بكەن لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا، چونكە ڕۆژی تەكبیراتە) .

**٣٩** - لە نافع ەوە، لە عبد اللّٰهی كوڕی عمر ەوە رضي الله عنهما، ووتی : (دەردەچوو لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان بۆ نوێژگە جا تەكبیراتی دەكرد بەدەنگی بەرز هەتاوەكو ئیمام دەهات) .

**٤٠** - وە لە نافع ەوە ووتی : (عبد اللّٰهی كوڕی عمر رضي الله عنهما زەكاتی سەرفیترەی دەردەكرد پێش ئەوەی بچێت بۆ نوێژگە، وە تەكبیراتی دەكرد بە ئاشكرا پێش ئەوەی بچێتە ناو نوێژگە، وە لە نوێژگەش تەكبیراتی دەكرد هەتاوەكو ئیمام دەهات بۆ نوێژگە، وە نوێژی نەدەكرد نە لە پێشی نوێژی جەژنەكانەوە نە لە دوایانەوە) .

**٤١** - وە لە نافعەوە كەوا عبد اللّٰهی كوڕی عمر رضي الله عنهما : (دەردەچوو لە مزگەوتەوە بۆ نوێژی دوو جەژنەكە جا تەكبیراتی دەكرد هەتاوەكو دەگەیشتە نوێژگە وە تەكبیراتی دەكرد هەتاوەكو ئیمام دەهات) .

٤٢ - وه له محمدى كوڕى إبراهيم ەوه ووتى : (أبو قتادة رضي الله عنه دەردەچوو بۆ نوێژى جەژن جا تەكبيراتى دەكرد، وه زيكرى الله عزَّوَجَل ى دەكرد هەتاوەكو دەگەيشته نوێژگه) .

٤٣ - وه له نافعەوه كەوا عبد اللهى كوڕى عمر رضي الله عنهما : (تەكبيراتى دەكرد ڕۆژى جەژن هەتاوەكو دەگەيشته نوێژگه، وه تەكبيراتى دەكرد هەتاوەكو ئيمام دەهات) .

٤٤ - وه له هيشامى كوڕى عورووه وه : (كەوا باوكى تەكبيراتى دەكرد ڕۆژى دوو جەژنەكه كاتێك دەردەچوو بۆ نوێژى جەژنى ڕەمەزان و قوربان) .

٤٥ - وه له هيشامى كوڕى عورووەوه : (كەوا باوكى ئەگەر بڕۆيشتبا بۆ نوێژى جەژن تەكبيراتى دەكرد) .

٤٦ - وه له محمدى كوڕى ئيسحاقەوه ووتى : (نافعى كوڕى جبير م بينى تەكبيراتى دەكرد ڕۆژى جەژن وه دەيووت : الله أكبر الله أكبر، ئەى خەڵكينه تەكبيرات ناكەن؟ ) .

**٤٧** - وه له نافع ـه‌وه، له عبد اللّهى كوڕى عمر ـه‌وه رضي الله عنهما : (كه‌وا ئه‌و ته‌كبيراتى ده‌كرد به ده‌نگى به‌رز ڕۆژى جه‌ژن كاتێك ڕۆيشتبا بۆ نوێژگه هه‌تاوه‌كو ئيمام ده‌هات جا ته‌كبيراتى ده‌كرد به ته‌كبيراتى ئيمام) .

**٤٨** - وه له عثيمى كوڕى نسطاسه‌وه ووتى : (سه‌عيدى كوڕى المسيب ئاواى ده‌كرد) .

---

**: و اته وه‌كو ئه‌ثه‌رى ٤٧**

**٤٩** - وه له ئيبراهيمى كوڕى نشيطه‌وه ووتى : (به‌كرى كوڕى الأشج م بينى ئاواى ده‌كرد) .

**٥٠** - وه له نافعه‌وه، له عبد اللّهى كوڕى عمره‌وه رضي الله عنهما : (كه‌وا ئه‌و ئه‌گه‌ر ده‌رچووبا بۆ نوێژى جه‌ژنى قوربان و ڕه‌مه‌زان ته‌كبيراتى ده‌كرد) .

**٥١** - وه له نافعه‌وه، له عبد اللّهى كوڕى عمر ـه‌وه رضي الله عنهما : (كه‌وا ئه‌و ته‌كبيراتى ده‌كرد ڕۆژى جه‌ژنى ڕه‌مه‌زان هه‌تاوه‌كو ده‌گه‌يشته نوێژگه) .

**٥٢** - وه له ابن ابي ذئبه‌وه ووتی : (پرسیارم كرد له ابن شهاب الزهري له‌باره‌ی ته‌كبیرات كردن له شه‌وی جه‌ژنی ڕه‌مه‌زان جا ووتی : ته‌كبیرات ڕۆژی جه‌ژنی ڕه‌مه‌زانه، وه وازیهێنا له شه‌وی جه‌ژنی ڕه‌مه‌زان) .

**٥٣** - وه له زوهرییه‌وه ووتی : (خه‌ڵكی ته‌كبیراتیان ده‌كرد كاتێك كه له ماڵه‌كانیان ده‌رده‌چوون هه‌تاوه‌كو ده‌گه‌یشتنه نوێژگه، هه‌تاوه‌كو ئیمام ده‌رده‌چوو، جا كاتێك ئیمام ده‌رده‌چوو ئه‌وا بێده‌نگ ده‌بوون، جا ئه‌گه‌ر ته‌كبیراتی كردبا ئه‌وا ته‌كبیراتیان ده‌كرد) .

**٥٤** - وه له عبد الله ی كوڕی هیشامه‌وه كه‌وا : (ئه‌و گوێی له ته‌كبیراتی عمر ی كوڕی خطاب رضي الله عنه ده‌بوو وه ئه‌و ده‌ڕۆیشت له كۆڵانه‌كه‌وه، وه ئیمامی عمر ده‌ڕۆیشت له كۆتایی ڕۆژی جه‌ژن) .

**٥٥** - وه له یزیدی كوڕی باوكی زیاده‌وه ووتی : (كه‌وا ئیبراهیم و عبد الرحمن ی كوڕی أبي لیلی و سعیدی كوڕی جبیر ئه‌گه‌ر هاتبان بۆ نوێژی جه‌ژن ته‌كبیراتیان ده‌كرد له ڕێگادا، جا كاتێك ده‌گه‌یشتن داده‌نیشتن، وه هیچ نوێژێكیان نه‌ده‌كرد نه له پێشی نه له پاشی) .

**٥٦** - وه له یزیدی كوڕی باوكی زیاده‌وه ووتی : (عبد الرحمن ی كوڕی أبي لیلی و مجاهد و سعیدی كوڕی جبیرم بینی یان دوو له‌و سیانه، وه

ئەوانەی بینیومانن لە فەقیهەکانی خەڵکی لە دە ڕۆژەکە دەیانووت : الله أكبر، الله أكبر، لا اله الا الله، الله أكبر، الله أكبر ولله الحمد) .

**٥٧** - وە لە یزیدی کوڕی باوکی زیادەوە ووتی : (دەرچووم لەگەڵ عبد الرحمن ی کوڕی أبي ليلى و سعیدی کوڕی جبیر ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان بۆ الجبانة، جا تەکبیراتیان دەکرد و فەرمانیان بە ئەوانەی چوار دەوریشیان دەکرد کەوا تەکبیرات بکەن) .

**٥٨** - وە لە باوکی عبد الرحمن وە ووتی : (لە جەژنی ڕەمەزاندا زۆر توندتر بوون لە جەژنی قوربان .

وکیع ووتی : واتا لە تەکبیرات کردن .

محمدی کوڕی سعدون ووتی : ئەوە لەبەر ئەوەیە الله تعالى دەفەرمووێ : ﴿وَلِتُكۡمِلُواْ ٱلۡعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمۡ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ [**البَقَرَة** : ١٨٥] .

**٥٩** - وە لەجریر ەوە ووتی : (هیچ شتێکم لە جعفری کوڕی محمد نەبیستووە، جگە لەوەی ئەوم بینی لەگەڵ عبد اللهی کوڕی حسن تەکبیراتیان دەکرد لە ڕۆژی جەژن، وە دەنگیان بەرزتر بوو بەسەر دەنگی خەڵکییەوە) .

٦٠ - وه له جرير ـهوه ووتى : (عبد اللّٰهى كوڕى حسن و جعفرى كوڕى محمدم بينى تهكبيراتيان دهكرد له ڕۆژى جهژن، وه عبد اللّٰهى كوڕى حسن دهنگى بهرزتر بوو بهسهر دهنگى خهڵكييهوه) .

٦١ - وه له عبيد اللّٰهى كوڕى كثيرهوه كهوا (زاذان دهردهچوو له ڕۆژى جهژن بهناو كۆڵانهكاندا دهڕۆيشت و تهكبيراتى دهكرد و زيكرى اللّٰه عزَّوَجَل ى دهكرد ههتا دهگهيشته نوێژگه و الجبانة) .

## بابی : (٨)

## دەربارەی ئەوەی ڕیوایەتکراوە کە وا پێغەمبەر ﷺ و أبو بکر و عمر رضي الله عنهما نوێژی جەژنیان دەکرد پێش ووتاردان



٦٢ - لە نافعەوە، لە عبد اللّٰهی کوڕی عمر ەوە رضي اللّٰه عنهما کەوا (پێغەمبەر ﷺ، وە أبو بکر و عمر رضي اللّٰه عنهما نوێژی جەژنیان دەکرد پێش ووتاردان) .

٦٣ - وە لە عبد اللّٰهی کوڕی عمر ەوە رضي اللّٰه عنهما لە پێغەمبەرەوە ﷺ : (لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان ڕمێکی لەبەردەمیدا جێگیر کردبوو بەو ئاڕاستەوە نوێژی دەکرد، وە ووتاری دەدا لە دوای نوێژەکە) .

٦٤ - وە لە ابن شهابەوە کەوا (پێغەمبەر ﷺ نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربانی دەکرد پێش ووتاردان) .

**٦٥** - وه له ماليك ـهوه كـهوا پێ گهیشتووه كـهوا : (أبو بـكرى الـصديق و عمرى كـوڕى خطاب رضي الله عنهما بهو شێوهیان دهكـرد) .

**٦٦** - وه له ئهبو عبیدهوه مهولاى ابن أزهر كـهوا ووتى : (ئامادهى نوێژى جهژن بووم لهگهڵ عمرى كـوڕى خطاب رضي الله عنه جا هات و نوێژى جهژنى كـرد، پاشان ڕۆیشت ووتارى دا، جا فهرمووى : بێگومان ئهو دوو ڕۆژه پێغهمبهر ﷺ ڕێگرى كـردووه له به ڕۆژووبوون تیایاندا، ڕۆژى شـكـاندنى ڕۆژووهكـانتان **[جهژنى ڕهمهزان]**، وه كـۆتا ڕۆژ كـه تیایدا له سـهربڕاوهكـانتان دهخۆن **[جهژنى قوربان]** .

ئهبو عبید ووتى : پاشان ئامادهى نوێژى جهژن بووم لهگهڵ عثمان ى كـوڕى عفان رضي الله عنه جا هات و نوێژى جهژنى كـرد، پاشان ڕۆیشت ووتارى دا .

جا فهرمووى : بێگومان كـۆبووهتهوه بۆتان لهمڕۆدا دوو جهژن جا هەریەكـێك له خهڵكـى دهورووبهر پێى خۆشه بمێنێتهوه بۆ نوێژى ههینى ئهوا با چاوهڕێ بـكـات، وه ئهوهشى پێى خۆشه بگهڕێتهوه ئهوا ڕێگهم پێ دا **[واته دهتوانێ نوێژى ههینیهكـه نهكات والله اعلم]** .

ئەبو عبيد ووتى : پاشان ئامادەى نوێژى جەژن بووم لەگەڵ علي كوڕى أبو طالب رضي الله عنه، وە عثمان ى كوڕى عفان رضي الله عنه لە ماڵەكەى خۆيدا دەورە درابوو، جا هات و نوێژى جەژنى كرد، پاشان ڕۆيشت ووتارى دا).

٦٧ - وە لە ئەبو عبيدەوە ووتى : ئامادەى نوێژى جەژن بووم لەگەڵ عمرى كوڕى خطاب رضي الله عنه جا دەستى كرد بە نوێژ پێش ووتاردان، پاشان ڕۆيشت ووتارى دا بۆ خەڵكى ، جا فەرمووى : بێگومان پێغەمبەر ﷺ ڕێگرى كردووە لە بە ڕۆژووبوونى ئەم دوو ڕۆژە وەفەرمووى : ڕۆژى جەژنى ڕەمەزان شكاندنى ڕۆژووەكانتانە، وە ئەمما ڕۆژى جەژنى قوربان ئەوا لە سەربڕاوەكانتان بخۆن .

پاشان ئامادەى نوێژى جەژن بووم لەگەڵ عثمان ى كوڕى عفان رضي الله عنه جا دەستى كرد بە نوێژ پێش ووتاردان، وە فەرمووى : بێگومان كۆبووەتەوە بۆتان لەمڕۆدا دوو جەژن جا هەريەكێك لە خەڵكى دەوروبەرە ئەوا ڕێگەماندا بڕوات، وە ئەوەى پێى خۆشە بمێنێتەوە بۆ نوێژى هەينى ئەوا با بمێنێتەوە .

وە ئامادەى نوێژى جەژن بووم لەگەڵ علي كوڕى أبو طالب رضي الله عنه، جا دەستى كرد بە نوێژ پێش ووتاردان .

٦٨ - وه له ئه‌بو عبيده‌وه مه‌ولاى عبد الرحمن كورِى عوف كه‌وا ووتى : (ئاماده‌ى نوێژى جه‌ژنى قوربان بووم له‌گه‌ڵ عمرى كورِى خطاب رضي الله عنه جا هات دواى ئه‌وه‌ى خه‌ڵكى كۆبوونه‌وه، جا ده‌ستى كرد به نوێژ پێش ووتاردان، پاشان هه‌ستا و سوپاس و ستايشى الله عزَّوَجَل ى كرد به‌وه‌ى كه شايه‌نيه‌تى، پاشان فه‌رمووى : أمّا بعد بێگومان، من بيستم رسول الله ﷺ رِێگرى ده‌كرد له به رِۆژووبوونى ئه‌م دوو رِۆژه : رِۆژى جه‌ژنى رِه‌مه‌زان و جه‌ژنى قوربان، ئه‌مما رِۆژى جه‌ژنى رِه‌مه‌زان ئه‌وا شكاندنى رِۆژووه‌كانتانه وه جه‌ژنه بۆ مسوڵمانان، وه ئه‌مما رِۆژى جه‌ژنى قوربان ئه‌وا له سه‌ربرِاوه‌كانتان بخۆن .

ئه‌بو عبيد ووتى : پاشان ئاماده‌ى نوێژى جه‌ژنى رِه‌مه‌زان بووم له‌گه‌ڵ عثمان ى كورِى عفان رضي الله عنه، جا هات دواى ئه‌وه‌ى خه‌ڵكى كۆبوونه‌وه، جا ده‌ستى كرد به نوێژ پێش ووتاردان، پاشان هه‌ستا و سوپاس و ستايشى الله عزَّوَجَل ى كرد به‌وه‌ى كه شايه‌نيه‌تى هه‌تا ئێره متفق بوون، پاشان فه‌رمووى : أمّا بعد، بێگومان ئه‌مرِۆ رِۆژى جه‌ژنى قوربانه و رِۆژى هه‌ينيشه، وه ئه‌وانه دوو جه‌ژنن كۆبووه‌نه‌ته‌وه بۆمسوڵمانان له‌يه‌ك رِۆژدا، جا هه‌ريه‌كێك له خه‌ڵكى ده‌ورووبه‌ر پێى خۆشه زوو بگه‌رِێته‌وه بۆ ناو خێزانه‌كه‌ى ئه‌وا رِێگه‌مدا برِوات، وه ئه‌وه‌ى پێى خۆشه بمێنێته‌وه بۆ نوێژى هه‌ينى ئه‌وا با بمێنێته‌وه) .

**٦٩** - وه له ئه‌بو عبيده‌وه مه‌ولاى عبد الرحمن كورِى عوف كه‌وا (عمرى كورِى خطاب ى رضي الله عنه بينى كه جه‌ژنى قوربان بوو جا ده‌ستى كرد به نوێژ پێش ووتاردان، پاشان هه‌ستا دواى ئه‌وه‌ى نوێژى كرد، سوپاس و ستايشى الله تعالى ى كرد به‌وه‌ى كه شايه‌نيه‌تى، پاشان فه‌رمووى : أمّا بعد بێگومان، بێگومان رسول الله ﷺ رِێگرى كردووه له به رِۆژووبوونى ئه‌م دوو رِۆژه : رِۆژى جه‌ژنى رِه‌مه‌زان و جه‌ژنى قوربان، جا له سه‌ربرِاوه‌كانتان بخۆن .

وه ئه‌بو عبيد ووتى : پاشان ئاماده‌ى نوێژى جه‌ژنى رِه‌مه‌زان بووم له‌گه‌ڵ عثمان ى كورِى عفان رضي الله عنه له سه‌رده‌مى خه‌لافه‌ته‌كه‌ى، جا ده‌ستى كرد به نوێژ پێش ووتاردان، پاشان هه‌ستا و سوپاس و ستايشى الله تعالى ى كرد به‌وه‌ى كه شايه‌نيه‌تى، پاشان فه‌رمووى : أمّا بعد، بێگومان ئه‌مرِۆ رِۆژى جه‌ژنى رِه‌مه‌زانه و رِۆژى هه‌ينيشه، وه ئه‌وانه دوو جه‌ژنن كۆبوونه‌ته‌وه بۆمسوڵمانان له‌يه‌ك رِۆژدا، جا هه‌ريه‌كێك له خه‌ڵكى ده‌وروبه‌ر پێى خۆشه بمێنێته‌وه تا له‌گه‌ڵ ئێمه ئاماده‌ى نوێژى هه‌ينى بێت، وه ئه‌وه‌ى پێيخۆشه زوو بگه‌رِێته‌وه بۆ ناو خێزانه‌كه‌ى ئه‌وا رِێگه‌مدا برِوات) .

**٧٠** - وه له عبد الله‌ى كورِى عمر ه‌وه رضي الله عنهما ووتى : بيستم رسول الله ﷺ فه‌رمووى : (لێى بخۆن تا سێ رِۆژان) .

**٧١ -** وه له ئه‌بو عبیده‌وه مه‌ولای عبد الرحمن ی كوڕی عوف رضي الله عنه كه‌وا ووتی : (ئاماده‌ی نوێژی جه‌ژنی قوربان بووم له‌گه‌ڵ عمری كوڕی خطاب رضي الله عنه، ده‌ستی كرد به نوێژ پێش ووتاردان، پاشان ووتی بیستم رسول الله ﷺ فه‌رمووی : ڕێگری ده‌كرد له به ڕۆژووبوونی ئه‌م دوو ڕۆژه، ئه‌مما ڕۆژی جه‌ژنی ڕه‌مه‌زان ئه‌وا شكاندنی ڕۆژووه‌كانتانه وه جه‌ژنه بۆ مسوڵمانان، وه ئه‌مما ڕۆژی جه‌ژنی قوربان ئه‌وا له سه‌ربڕاوه‌كانتان بخۆن) .

ئه‌بو عبید ووتی : پاشان ئاماده‌ی نوێژی جه‌ژنی ڕه‌مه‌زان بووم له‌گه‌ڵ عثمان ی كوڕی عفان رضي الله عنه له ڕۆژی هه‌ینی، ده‌ستی كرد به نوێژ پێش ووتاردان، پاشان فه‌رمووی : بێگومان ئه‌وانه دوو جه‌ژنن كۆبوونه‌ته‌وه له‌یه‌ك ڕۆژدا، جا هه‌ریه‌كێك له خه‌ڵكی ده‌ورووبه‌ر پێی خۆشه بمێنێته‌وه له‌گه‌ڵمان تا ئاماده‌ی نوێژی هه‌ینی بێت با بیكات، وه ئه‌وه‌ی پێی خۆشه زوو بگه‌ڕێته‌وه بۆ ناو خێزانه‌كه‌ی ئه‌وا ڕێگه‌مدا بڕوات، با بیكات) .

**٧٢ -** وه له ئه‌بو عبیده‌وه مه‌ولای عبد الرحمن ی كوڕی عوف كه‌وا ووتی : ئاماده‌ی نوێژی جه‌ژن بووم له‌گه‌ڵ عمری كوڕی خطاب رضي الله عنه، جا فه‌وره‌مووده‌كه‌ی گێڕایه‌وه هاوشێوه‌ی فه‌رمووده‌ی یزیدی كوڕی زریع له معمر ـه‌وه هه‌تاوه‌كو ووته‌كه‌ی : وه ئه‌وه‌ی ده‌یه‌وێ ئاماده‌ی نوێژی هه‌ینی بێت له‌گه‌ڵمان با ئاماده‌بێت .

پاشان ئەبو عبيد ووتی : پاشان ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ علي كوڕی ئەبو طالب رضي الله عنه، جا نوێژی كرد پێش ئەوەی ووتار بدات بەبێ بانگ و بێ قامەت، پاشان ووتاريدا، جا فەرمووی : ئەی خەڵكينە بێگومان رسول الله ﷺ ڕێگری كردووە لەوەی لە سەربڕاوەكانتان بخۆن دوای سێ ڕۆژ جا لێی مەخۆن دوای ئەوە) .

**٧٣** - وە لە ئەبو عبيدەوە مەولای عبد الرحمن ی كوڕی عوف رضي الله عنه ووتی : (دوو جەژن كۆبوونەوە لە خەلافەتی عثمان ی كوڕی عفان رضي الله عنه، جا ئيمامی عثمان رضي الله عنه فەرمووی : ئەوەی پێی خۆشە لە خەڵكی دەوروبەر كەوا ئامادەی نوێژی هەينی بێت لەگەڵمان با ئامادەبێت، وە ئەوەی پێی خۆشە كەوا بڕواتەوە با بڕوات) .

وە ئامادەبووم لەگەڵ ئيمامی علي رضي الله عنه بۆ نوێژی جەژن لە كاتێكدا ئيمامی عثمان دەورەی ماڵەكەی درابوو، جا ئيمامی علي رضي الله عنه فەرمووی : رسول الله ﷺ فەرمووی : حەڵاڵ نييە بۆ مسوڵمان كەوا لە سەربڕاوەكەی بخوات لەدوای سێ ڕۆژ .

**٧٤** - وە لە ئەبو عبيدەوە مەولای بنی أزهر ووتی : ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ عمر ی كوڕی خطاب رضي الله عنه، جا دەستی كرد بە نوێژ پێش ئەوەی ووتاربدات، پاشان ووتاريدا و فەرمووی : بێگومان رسول الله ﷺ

ڕێگری کردووە لە بە ڕۆژووبوونی ئەم دوو جەژنە، ئەمما یەکەمیان ڕۆژی شکاندنی ڕۆژووەکانتانە، وە ئەمما جەژنەکەیترتان ڕۆژێکە تێیدا لە سەربڕاوەکانتان دەخۆن .

ئەبو عبید ووتی : پاشان ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ عثمان ی کوڕی عفان رضي الله عنه، ڕۆژی هەینی بوو جا نوێژی کرد پێش ئەوەی ووتاربدات، پاشان ووتاریدا بۆ خەڵکی و فەرمووی : بێگومان ئەمە ڕۆژێکە دوو جەژن کۆبووەتەوە بۆتان، جا هەریەکێك لە خەڵکی دەورووبەر پێی خۆشە چاوەڕێی نوێژی هەینی بکات با چاوەڕێ بکات، وە ئەوەی پێیخۆشە زوو بگەڕێتەوە بۆ ناو خێزانەکەی ئەوا با بگەڕێتەوە بێگومان ڕێگەمدا بڕوات .

ئەبو عبید ووتی : پاشان ئامادەبووم لەگەڵ ئیمامی علي رضي الله عنه بۆ نوێژی جەژن لە کاتێکدا ئیمامی عثمان رضي الله عنه دەورەی ماڵەکەی درابوو، جا نوێژی کرد پێش ئەوەی ووتار بدات، پاشان فەرمووی : ئەی خەڵکینە بێگومان رسول الله ﷺ ڕێگری لێکردوون لە سەربڕاوەکانتان بخۆن لە سەرووی سێ ڕۆژ جا لێی مەخۆن لەدوای ئەو سێ ڕۆژە) .

**٧٥ -** وە لە ئەبو عبیدەوە مەولای بنی أزهر ووتی : (ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ عمر ی کوڕی خطاب رضي الله عنه، جا دەستی کرد بە نوێژ پێش ئەوەی ووتاربدات، پاشان ووتاریدا و فەرمووی : بێگومان رسول الله ﷺ ڕێگری کردووە لە بە ڕۆژووبوونی ئەم دوو جەژنە، ئەمما یەکەمیان ڕۆژی

شكاندنی ڕۆژووەكانتانە، وە ئەمما جەژنەكەیترتان ڕۆژێكە تێیدا لە سەربڕاوەكانتان دەخۆن .

ئەبو عبید ووتی : پاشان ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ عثمان ی كوڕی عفان رضي الله عنه، ڕۆژی هەینی بوو جا نوێژی كرد پێش ئەوەی ووتاربدات، پاشان ووتاریدا بۆ خەڵكی و فەرمووی : بێگومان ئەمە ڕۆژێكە دوو جەژن كۆبووەتەوە بۆتان، جا هەریەكێك لە خەڵكی دەوروربەر پێی خۆشە چاوەڕێی نوێژی هەینی بكات با چاوەڕێ بكات، وە ئەوەی پێیخۆشە زوو بگەڕێتەوە بۆ ناو خێزانەكەی ئەوا بابگەڕێتەوە بێگومان ڕێگەمدا بڕوات .

ئەبو عبید ووتی : پاشان ئامادەبووم لەگەڵ ئیمامی علي رضي الله عنه بۆ نوێژی جەژن لە كاتێكدا ئیمامی عثمان رضي الله عنه دەورەی ماڵەكەی درابوو، جا نوێژی كرد پێش ئەوەی ووتار بدات، پاشان فەرمووی : ئەی خەڵكینە بێگومان رسول الله ﷺ ڕێگری لێكردوون لە سەربڕاوەكانتان بخۆن لە سەرووی سێ ڕۆژ) .

٧٦ - لە عبد الله ی كوڕی عباس ـەوە رضي الله عنهما فەرمووی : (ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ رسول الله ﷺ، وە لەگەڵ ئەبو بكر، وە لەگەڵ عمر رضي الله عنهما جا دەستیان كرد بە نوێژ پێش ووتاردان) .

٧٧ - له عبد الله ی كوڕی عباس ەوە رضي الله عنهما فەرمووی : (ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ رسول الله ﷺ، وە لەگەڵ ئەبو بكر و عمر و عثمان رضي الله عنهم جا هەموویان دەستیان كرد بە نوێژ پێش ووتاردان) .

٧٨ - وە له عبد الله ی كوڕی عباس ەوە رضي الله عنهما كەوا (پێغەمبەر ﷺ نوێژی جەژنی بۆ كردن لەلای ماڵی كثیری كوڕی الصلت، جا نوێژی كرد پێش ئەوەی ووتار بدات، وە باسی هیچ بانگ و قامەتێكی نەكرد .

وە ئەگەر نزیكیم نەبوایە لەو نەمدەبینی لەبەر بچووكیم) .

٧٩ - وە له عبد اللهی كوڕی عباس ەوە رضي الله عنهما فەرمووی : (شایەتی دەدەم كەوا رسول الله ﷺ نوێژی كرد پێش ووتاردان جا وا هەستی كرد كە دەنگی نەگەیشتووە بە ئافرەتان، جا هاتن بۆ لای و هانیدان لەسەر بەخشین و خێركردن ئافرەتی وا هەبوو گوارە و مستیلەكەی دەبەخشی، وە بیلالیش دەیخستە ناو پۆشاكەكەیەوە .

ووتی : جا دابەشیكرد بەسەر هەژارانی مسوڵمانانەوە) .

٨٠ - وە له عبد اللهی كوڕی عباس ەوە رضي الله عنهما فەرمووی : (شایەتی دەدەم كەوا رسول الله ﷺ نوێژی كرد پێش ووتاردان جا وای بینی كە ئافرەتان ووتارەكەیان نەبیستووە، جا چوو بۆ لایان و بیلالیشی لەگەڵ

بوو، بیری خستنەوە و ئامۆژگاریکردن و فەرمانی پێکردن کەوا ببەخشن لە پێناو الله تعالی، تا وایلێهات گوارە و مستیلەکانیان دەخستە ناو پۆشاکی بیلالەوە رضي الله عنه).

**٨١** - وە لە عبد اللهی کوڕی عباس ەوە رضي الله عنهما فەرمووی: (شایەتی دەدەم کەوا رسول الله ﷺ نوێژی کرد پێش ووتاردان، پاشان ووتاریدا جا وای بینی کە ئافرەتان ووتارەکەیان نەبیستووە، جا چوو بۆ لایان و بیلالیشی لەگەڵ بوو جلەکەی بڵاو کردبوویەوە، جا ئامۆژگاریکردن و فەرمانی پێکردن کەوا ببەخشن لە پێناو الله تعالی، تا وایلێهات ئافرەت فڕێی دەدا وە ئەیوب ئاماژەی کرد بۆ گوێ و ملی).

**٨٢** - وە لە عبد اللهی کوڕی عباس وە رضي الله عنهما فەرمووی: (شایەتی دەدەم کەوا رسول الله ﷺ نوێژی کرد پێش ووتاردان جا وای بینی کە ئافرەتان ووتارەکەیان نەبیستووە، جا چوو بۆ لایان و الله عزَّوَجَل ی بیر خستنەوە و ئامۆژگاریکردن و فەرمانی پێکردن کەوا ببەخشن لە پێناو الله تعالی، وە بیلالیش پۆشاکەکەی بڵاو کردبووەوە، تا وایلێهات ئافرەت گوارە و مستیلەکانیان فڕێدەدایە ناو پۆشاکی بیلالەوە رضي الله عنه.

محمدی کوڕی سعودن ووتی: الخرص: گوارەی دەنکۆڵە).

**٨٣** - وه له عطاء كهوا شايهتيدا بۆ عبد اللّهى كوڕى عباس رضي الله عنهما وه عبد اللّهى كوڕى عباس يش شايهتيدا بۆ رسول الله ﷺ كهوا (نوێژى كرد له ڕۆژى جهژن پاشان ووتاريدا بۆ ئافرهتان، پاشان فهرمانى پێكردن به خێركردن جا ئهوانيش فڕێيان دهدا [ئهو زێڕانهى كه دهيانبهخشى فڕێييان دهدا بۆ ناو پۆشاكێك) .

**٨٤** - له جابرى كوڕى عبد اللّهوه رضي الله عنهما ووتى : (رسول الله ﷺ ڕۆژى جهژنى ڕهمهزان دهستى دهكرد به نوێژ پێش ووتاردان، پاشان ووتاريدا بۆ خهڵكى، جا كاتێك تهواو بوو له ووتاردان هات بۆ لاى ئافرهتان و بيرى خستنهوه وه ئهو خۆى دابووه سهر دهستى بيلال رضي الله عنه وه بيلاليش جلهكهى فراوان كردبوو ئافرهتان سهدهقهكانيان دهخسته ناوى) .

**٨٥** - وه له عطاء له عبد اللّهى كوڕى عباسهوه رضي الله عنهما فهرمووى : (پێغهمبهرم ﷺ بينى وه ئهبو بكر و عمر يش رضي الله عنهما نوێژيان دهكرد پێش ووتاردان لههەر دوو جهژنهكه) .

وه به ههمان شێوه له عطاء له جابرهوه رضي الله عنه فهرمووى : نوێژى جهژنم كرد لهگهڵ رسول الله ﷺ پێش ووتاردان .

علي كوڕى نصر ووتى : ههموويان ڕيوايهتيان كردووه له عبد اللّهى كوڕى عباس و جابرهوه رضي الله عنهم) .

٨٦ - وه له جابرەوه رضي الله عنه فەرمووی : (ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ رسول الله ﷺ جا دەستی کرد به نوێژ پێش ووتاردان بەبێ بانگ و قامەت) .

٨٧ - وه له جابرەوه رضي الله عنه فەرمووی : (ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ رسول الله ﷺ جا دەستی کرد به نوێژ پێش ووتاردان بەبێ بانگ و قامەت) .

٨٨ - وه له جابری کوڕی عبد الله رضي الله عنهما کەوا (نوێژی جەژنی کرد لەگەڵ رسول الله ﷺ بەبێ بانگ و قامەت دەستی کرد به نوێژ پێش ووتاردان وه ئەو خۆی دابووه سەر بیلال، پاشان چووه لای ئافرەتەکان، جا ئامۆژگاری کردن و بیری خستنەوەو فەرمووی : بەڕاستی ئێوه زۆربەی سووتەمەنی ئاگرن .

ئافرەتێك لەوان له ئافرەتەکانی دواوه هەستایەوه، ووتی : بۆچی ئەی رسول الله ﷺ؟

فەرمووی : ئێوه زۆر گلەیی و سکاڵا دەکەن ، وه کوفرانەی نیعمەت دەکەن [واته پیاوەکانیان گەر یەك هەڵە بکات هەموو باشیەکانی لەبەرچاو نامێنێت] .

فەرمووی : جا ئافرەتەکان ملوانکە و هەنگوستیلەکانیان لەبەر دەکردەوە، دەیانبەخشی و دەیاندا بە بیلال رضي الله عنه) .

**٨٩** - وە لە جابرەوە رضي الله عنه فەرمووی : (ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ رسول الله ﷺ لە ڕۆژی جەژن جا دەستی کرد بە نوێژ پێش ووتاردان بەبێ بانگ و قامەت، هەستاوە و خۆی دابووە سەر بیلال، جا سوپاس و ستایشی الله عزَّوَجَل ی کرد، وە ئامۆژگاری ئافرەتانی کرد و بیری خستنەوە و فەرمانی پێکردن بە ترسان لە الله تعالى، وە فەرمووی : ببەخشن .

وە باسی شتێك لە سزای دۆزەخی کرد، ئافرەتێك لەدواوەی ئافرەتەکان، کە ڕوومەتی ڕەش بوو، هەستایەوە و ووتی : ئەی رسول الله ﷺ، بۆچی ؟

فەرمووی : لەبەر ئەوەی ئێوە زۆر گلەیی و سکاڵا دەکەن و کوفرانەی نیعمەت دەکەن .

فەرمووی : جا ئافرەتەکان زێڕ و گوارە و مستیلەکانیان لە خۆیان دەکردەوە و دەیانبەخشی و دەیانخستە ناو پۆشاکی بیلالەوە رضي الله عنه).

**٩٠** - وە لە زیادی کوڕی علاقە و عبد الملك کوڕی عمیرەوە : کەوا (المغيرة ی کوڕی شوعبة رضي الله عنه ڕۆژی جەژن نوێژی کرد، پاشان ووتاریدا لە سەر ووشترەکەی) .

٩١ - وه له ئهبى سعيدى الخدرييهوه ضي الله عنه فهرمووى : (رسول الله ﷺ رۆژى جهژن ووتارى بۆ داين لهسهر سوارييهكهى) .

٩٢ - وه له ئيمامى شهعبييهوه ووتى : (المغيرة ى كورِى شوعبهم بينى نوێژى جهژنى بۆ كردين له رۆژى جهژن، ووتاريدا دواى ئهوهى نوێژى كرد، بهشێوهيهك زۆرباش) .

٩٣ - وه له جابرى كورِى عبد الله رضي الله عنهما فهرمووى : (رسول الله ﷺ نوێژى جهژنى بۆ كردين پێش ووتاردان بهبێ بانگ و قامهت) .

## بابى : (٩)

## دەربارەی ئەوەی ڕیوایەتکراوە لە تەکبیرەی ئیمام لە نوێژی جەژندا، وە چەند الله اكبر دەكات



**٩٤** - لە دایکی ئیمانداارانەوە عائشة رضي الله عنها کە وا (رسول الله ﷺ تەکبیراتی دەکرد لە نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان لە ڕکعاتی یەکەمدا حەوت الله أكبر، وە لە دووەمدا پێنج الله أكبر) .

**٩٥** - وە لە حفص ی کوڕی عمر ی کوڕی سعد القرظي کەوا (باوکی و مامەکانی هەواڵیان پێداوە لە باوکیەوە وە القرظ بانگبێژی ئەهلی قباء بووە جا ئیمامی عمر رضي الله عنه گواستوویەتیەوە کردوویەتی بە بانگبێژ : کەوا سوننەت وایە لە نوێژی جەژنی قوربان و ڕەمەزان ئیمام حەوت الله أكبر بکات لە ڕکعاتی یەکەم پێش خوێندنەوەی سورەتی فاتیحە، وە پێنج الله أكبر دەکات لە ڕکعاتی دووەمدا پێش خوێندنەوەی سورەتی فاتیحە) .

**٩٦** - وه ابن شهابهوه ووتى : (سوننهتى تهكبيرات له نوێژى جهژنى قوربان و ڕهمهزان ئهوهيه كه حهوت الله أكبر بكرێ له ڕكعاتى يهكهمدا، پاشان فاتيحه دهخوێنێ لهگهڵ سوڕهتێك له المفصل دهخوێنێت، وه پێنج الله أكبر دهكات له ڕكعاتى دووهمدا پێش خوێندنهوهى قورئان، پاشان فاتيحه دهخوێنێ لهگهڵ سوڕهتێك له المفصل) .

---

**المفصل : بههۆى ئهوهى بسملة دهخرێته نێوان سوڕهتهكان، يانى كه سوڕهتهكهى تهواو كرد دێته دواى ئهو، بۆيهش پێى دهوترێ (المفصل) .**

**جا المفصل سێ جۆرى ههيه :**

**طوال المفصل : المفصل ى درێژ: له سوڕهتى ق تاوهكو جزء عم .**

**الأوساط المفصل : له جزء عم تاوهكو سوڕهتى الضحى .**

**قصار المفصل : له سوڕهتى الضحى تاوهكو سوڕهتى الناس .**

**والله تعالى أعلم .**

**٩٧** - وه له وهليدى كوڕى مسلمة وه ووتى : (به ئهوزاعيم ووت، چهند تهكبيرات دهكرێ له نوێژى جهژندا؟

وتى : حهوت و پێنج .

بيستم زهري دەيووت : بێگومان سوننەت واهاتووە لە نوێژی جەژندا، کەوا حەوت الله أکبر بکرێ لە ڕکعاتی یەکەمدا پاشان قورئان دەخوێنێت، پاشان الله أکبر دەکات جا رکوع دەبات، پاشان سوجدە دەبات، پاشان هەڵدەستێتەوە جا پێنج الله أکبر دەکات، پاشان قورئان دەخوێنێ جا الله أکبر دەکات و سوجدە دەبات) .

**٩٨** - وە ابن شهابەوە ووتی : (لەبارەی تەکبیرات لە نوێژی جەژنی قوربان و ڕەمەزان : دەست پێدەکات جا حەوت الله أکبر دەکات لە ڕکاعەتی یەکەمدا، پاشان سورەتێك لە المفصل دەخوێنێ، پاشان پێنج الله أکبر دەکات لە ڕکعاتی دووەمدا، پاشان سورەتێك لە المفصل دەخوێنێ) .

**٩٩** - لە نافعەوە، کەوا بیستوویەتی لە أبو هريرة رضي الله عنه : (الله أکبر دەکرێ لە نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان لە سوجدەی یەکەم **[مەبەست پێی ڕکعاتی یەکەمە والله اعلم]**، حەوت جار و لە دووەم پێنج جار) .

**١٠٠** - لە نافعەوە ووتی : (ئامادەی نوێژی جەژنی قوربان و ڕەمەزان بووم لەگەڵ أبو هريرة رضي الله عنه : جا الله أکبری کرد لە ڕکعاتی یەکەم حەوت جار پێش قورئان خوێندنەوە وە لە ڕکعاتی دووەم پێنج جار پێش قورئان خوێندنەوە) .

١٠١ - وه له نافعهوه، كهوا (أبو هريرة رضي الله عنه مهروانى كوڕى حكم لهدوايهوه بوو : جا نوێژى ههردوو جهژنهكهى بۆ كردن جا حهوت الله أكبرى كرد له ڕكاعهتى يهكهمدا، پاشان قورئانى خوێند و الله أكبرى كرد، پاشان ههستا و جا پێنج الله أكبرى كرد، پاشان قورئانى خوێند و الله أكبرى كرد) .

١٠٢ - وه له نافعهوه ووتى : (نوێژى جهژنم كرد لهدواى أبو هريرة رضي اله عنه، جا حهوت الله أكبرى كرد له ڕكعاتى يهكهمدا وه له ڕكعاتى دووهم پێنج جار ههموويان پێش قورئان خوێندنهوه) .

١٠٣ - وه له نافعهوه، له أبو هريرهوه رضي الله عنه كهوا (ئهبو هريره رضي الله عنه دوازده الله أكبرى دهكرد له دوو جهژنهكه حهوتيان له ڕكعاتى يهكهمدا وه پێنجيان له ڕكعاتى دووهم ههموويان پێش قورئان خوێندنهوه) .

١٠٤ - له نافعهوه، كهوا بيستوويهتى له أبو هريرة رضي الله عنه : (الله أكبر دهكرێ له نوێژى جهژنى ڕهمهزان و قوربان له سوجدهى يهكهم، حهوت جار و له دووهم پێنج جار) .

**١٠٥** - وه له ئەبو يونس ەوه ووتی : (أبو هريرەم بينی تەكبيراتی دەكرد له نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان، له ڕكعاتی يەكەم حەوت جار و له دووەم پێنج جار) .

**١٠٦** - وه له عمری كوڕی عبد العزيزەوه كەوا (ئەو تەكبيراتی دەكرد له نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان حەوت و پێنج، دەستی دەكرد به تەكبير كردن پێش خوێندنەوەی فاتيحه له هەردوو ڕكاعەتەكه) .

**١٠٧** - وه له حريزەوه ووتی : (نوێژی دوو جەژنەكەم كرد لەگەڵ عمر ى كوڕی عبد العزيز : تەكبيراتی دەكرد له نێوياندا حەوت الله أكبر له ڕكعاتی يەكەم و پێنجيش له كۆتايی دەستی پێدەكرد جا الله أكبری دەكرد، پاشان قورئانی دەخوێندەوه و ڕكوعی دەبرد، پاشان هەڵدەستا و جا الله أكبری دەكرد، پاشان قورئانی دەخوێندەوه و ڕكوعی دەبرد) .

**١٠٨** - له ثابتی كوڕی قيسەوه ووتی : (بيستم عمر ى كوڕی عبد العزيز : تەكبيراتی دەكرد له نوێژی دوو جەژنەكه، حەوت الله أكبر له ڕكعاتی يەكەم و پێنجيش له كۆتايی) .

**١٠٩** - له وهيب ەوه بۆی گێڕاينەوه عبيد اللهی كوڕی عمر ووتی : (ئەميری ئەميرەكان نوێژی بۆ كردين له ڕۆژی جەژن، جا ئاوڕی داوه بۆلای عبيد اللهی

كوڕی عمر جا پرسیاری لێكرد لەبارەی تەكبیراتەكان جا ووتی : حەوت تەكبیرات بكە لە ڕكعاتی یەكەم و پێنجیش لە كۆتایی، وە سورەتی جیاواز بخوێنە) .

عبيد اللهی كوڕی عمر ووتی : ئەوە سوننەتە لای ئێمە .

وە وهیب ووتی : یحیي ی كوڕی سعید ووتی : ئەوە سوننەتە لای ئێمە .

**١١٠** - وە لە عبيد اللهوە ووتی : (ئەمیرێك لە خەڵكی شام هات بۆ لامان، جا كاتێك ویستی نوێژ بكات تەكبیراتی لێ تێكچوو، جا ئاوڕی داوە بۆ لای عبيد اللهی كوڕی عبد اللهی كوڕی عمر رضي الله عنهما، وە منیش لەگەڵی بووم، جا ووتی تەكبیراتی نوێژی جەژن چۆنە ئەی عبيد الله؟

ووتی : حەوت تەكبیرات لە ڕكعاتی یەكەم و پێنجیش لە كۆتایی .

هاوشێوەی ووتەی أبو هريرة رضي الله عنه) .

**١١١** - وە لە محمدی كوڕی هلالەوە ووتی : (بیستم لە فەرمانبەرێك كە لەسەر مەدینە بوو ڕۆژی جەژن لە نوێژگە دەیووت : بێگومان پێویستە لەسەر پیاو كە پرسیار لە خەڵكی شارەكە بكات ئەگەر سوننەتێكی نەزانی، جا سوننەتەكەتان چۆنە؟

جا سالم ووتی : حەوت تەكبیرات بكە لە ڕكعاتی یەكەم، وە سورەتی سبح اسم ربك الأعلى تێدا بخوێنە وە پێنج تەكبیرات بكە لە كۆتایی) .

**١١٢** - وە لە بردەوە ووتی : (مكحول لە نوێژی دوو جەژنەكە : حەوت اللّٰه أكبری دەكرد، پاشان قورئانی دەخوێندەوە، پاشان پێنج اللّٰه أكبری دەكرد و پاشان قورئانی دەخوێندەوە) .

**١١٣** - لە ابن شهابەوە ووتی : (سوننەت لە نوێژی جەژنی قوربان و ڕەمەزان ئەوەیە كە ئیمام و ئەوانەی لە دوایەوەن حەوت اللّٰه أكبر دەكەن لە ڕكعاتی یەكەمدا پێش قورئان خوێندنەوە، پاشان فاتیحە دەخوێنێ لەگەڵ سورەتێك لە المفصل، وە پێنج اللّٰه أكبر دەكات لە ڕكعاتی دووەمدا پێش خوێندنەوەی قورئان، پاشان فاتیحە دەخوێنێ لەگەڵ سورەتێك لە المفصل) .

**١١٤** - وە لە عبد اللّٰه ی كوڕی عباس ەوە ووتی : (تەكبیرات لە دوو جەژنەكە سێزدەیە، حەوت و شەش) .

**١١٥** - وە لە عطاء لە لبد اللّٰهی كوڕی عباسەوە كەوا (تەكبیراتی دەكرد لە نوێژی جەژنی ڕەمەزان سێزدە جار) .

**١١٦** - وە لە عبد اللّٰهی كوڕی عباسەوە رضي اللّٰه عنهما فەرمووی : (حەوت اللّٰه أكبر دەكرێ لە ڕكعاتی یەكەمدا بە اللّٰه أكبری دەست پێكردنەوە،

وه له ڕكعاتی دووەمدا شەش جار بە الله أكبرى چوونه ركوع هەموويان پێش قورئان خوێندنەوە) .

**١١٧** - وه له عبد اللهى كوڕى عباس ـەوه رضي الله عنهما فەرمووى : (تەكبيرات له نوێژى جەژنى ڕەمەزان ئەوەيە الله أكبر دەكات نوێژەكە دەست پێدەكات، پاشان شەش الله أكبر دەكات، پاشان قورئان دەخوێنێ، پاشان الله أكبر دەكات و ڕكوع دەبات، پاشان هەڵدەستێت و پێنج جار الله أكبر دەكات، پاشان قورئان دەخوێنێ، پاشان الله أكبر دەكات و ڕكوع دەبات) .

**١١٨** - وه له عبد اللهى كوڕى عباس ـەوه رضي الله عنهما كەوا (دوازده الله أكبرى كرد له نوێژى جەژن) .

**١١٩** - وه له عبد اللهى كوڕى عباس ـەوه رضي الله عنهما كەوا (سێزده تەكبيراتى دەكرد له نوێژى دوو جەژنەكە، حەوتيان له ڕكعاتى يەكەم و شەشيان له ڕكاعەتى كۆتايى له پاشاندا قورئانى دەخوێنند) .

**١٢٠** - وه له معن ـەوه ووتى : مالكى كوڕى ئەنەس ووتى : (هەموو كەسێك له پياو و ئافرەت ئەگەر بيەوێت بۆ خۆى نوێژى دوو جەژنەكە بكات ئەوا من وايدەبينم حەوت الله أكبر بكات له ڕكعاتى يەكەمدا پێش

قورئان خوێندنەوە، وە لە ڕکعاتی دووەمدا پێنج جار بە اللە أکبر بکات پێش قورئان خوێندنەوە) .

**١٢١** - وە لە لیث ەوە ووتی : ربیعە ووتی : (تەکبیرات حەوتیان لە ڕکعاتی یەکەمە، وە پێینجیان لە ڕکعاتی دووەم ، وە بانگ و قامەتیشی تێدا نییە) .

**١٢٢** - وە لە سعیدی کوڕی جبیر و مجاهدەوە رحمهما اللە ووتیان : (تەکبیرات لە نوێژی جەژندا حەوت و پێنجە، سعید ووتی : لە ڕکعاتی یەکەمدا حەوت اللە أکبر دەکات، پاشان قورئان دەخوێنێتەوە، پاشان هەڵدەستێتەوە بۆ ڕکعاتی دووەم و قورئان دەخوێنێتەوە، پاشان پێنج اللە أکبر دەکات بە ڕکوعەوە) .

**١٢٣** - وە لە خصیفەوە کەوا (عمری کوڕی عبد العزیز تەکبیراتی دەکرد لە دوو جەژنەکە حەوت جار و پێنج جار) .

**١٢٤** - وە لە عمروی کوڕی شعیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە عبد اللەی کوڕی عمروی کوڕی عاص رضي اللە عنهما ووتی : (رسول اللە ﷺ حەوت اللە أکبری کرد لە ڕکعاتی یەکەمدا لە نوێژی جەژن، پاشان قورئانی خوێندەوە، پاشان اللە أکبری کرد و چووە ڕکوع، پاشان سوجدەی برد،

پاشان هەستایەوە و پێنج الله أكبری كرد، پاشان قورئانی خوێندەوە، پاشان الله أكبری كرد و چووە ڕكوع، پاشان سوجدەی برد) .

**١٢٥** - وە لە وەلیدەوە ووتی : ووتم بە ئەوزاعی : ئایا دەستم بەرز بكەمەوە وەكو تەكبیرەی نوێژ؟

ووتی : بەڵێ، دەستت بەرز بكەوە لەهەر هەموویان) .

**١٢٦** - وە ولید ووتی : پرسیارم كرد لە مالكی كوڕی ئەنەس لەوبارەوە ووتی : (بەڵێ دەستت بەرز بكەوە لەگەڵ هەموو الله أكبر ێك، وە هیچ شتێكم نەبیستووە تێیدا) .

## بابی : (١٠)

## قورئان خوێندنەوە لە نوێژی جەژن



**١٢٧** - وە لە عبيد اللهی كوڕی عبد اللهی كوڕی عتبەی كوڕی مسعود كەوا عمری كوڕی خطاب رضي الله عنه پرسیاری كرد لە ئەبو واقدی لیثی : رسول الله چی دەخوێند لە نوێژی جەژنی قوربان و ڕەمەزان؟

ووتی : سورەتی ﴿قٓ ۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ﴾ و ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ﴾ی دەخوێند .

**١٢٨** - وە لە ئەبو كینانەی قورەیشی ووتی : (كاتێك ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان هات دەرچووین لەگەڵ ئەبو موسى ئەشعەری رضي الله عنه جا ڕیزمان بەست لەدوای ئەو، پاشان ڕووی كردە قیبلە و چوار الله أكبری كرد، یەك بەدوای یەك نەیكرد، پاشان ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى﴾ ی خوێند، پاشان الله أكبری پێنجەمی كرد، پاشان ڕكوعی برد، پاشان هەستایەوە بۆ ڕكعاتی دووەم و فاتیحە و ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ و ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ ی خوێند، پاشان

سێ الله أكبرى كرد، پاشان الله أكبرى چوارەمى كرد و چووە ڕكوع، كاتێك نوێژی تەواو كرد چووە سەر مینبەر ڕووی كردە ئێمە، سەلامی كرد و پاشان ووتی : (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَانَا لِلْإِسْلَامِ، وَجَعَلَهُ دِينًا وَمَنّ عَلَيْنَا بِمُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَجَعَلْنَا فِي خَيْرِ الْأُمَمِ وَأَلْزَمَنَا كَلِمَةَ التَّقْوَى، وَالْعُرْوَةَ الْوُثْقَى، وَجَنَّبَنَا عِبَادَةَ الطَّوَاغِيتِ وَالْأَصْنَامِ وَالسُّجُودِ لِلشَّمْسِ وَالْقَمَرِ)، پاشان شەش الله أكبرى كرد بەئیخلاص و تەواویەوە، پاشان حەوتەم جار ووتی الله أكبر على ما هدانا، پاشان ئەو ئایەتانەی خوێندەوە لە سورەتی الأحزاب ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكۡرٗا كَثِيرٗا وَسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا هُوَ ٱلَّذِي يُصَلِّي عَلَيۡكُمۡ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ﴾هەتاوەكو ووتەی ﴿وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا﴾، [**الأحزَاب** : ٤٩] .

پاشان شەش الله أكبرى كرد بەئیخلاصەوە پاشان حەوتەم جار ووتی الله أكبر على ما هدانا، پاشان ئەو ئایەتانەی خوێندەوە لە سورەتی النحل ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ﴾ [**النحل** : ٩٠]، هەتاوەكو گەیشتە ﴿وَلَنَجۡزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ [**النَّحل** : ٩٥] .

پاشان شەش الله أكبرى كرد بەئیخلاصەوە، حەوتەم جار ووتی الله أكبر على ما هدانا، پاشان خوێندیەوە ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ﴾ [**الإسراء** : ٢٣] هەتاوەكو گەیشتە ﴿مَلُومٗا مَّدۡحُورًا﴾، [**الإسْرَاء** : ٣٩] .

پاشان شەش الله أكبرى كرد بەئیخلاصەوە، حەوتەم جار ووتی الله أكبر على ما هدانا پاشان خوێندیەوە ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ﴾ [**اللـَّيل** : ١] هەتاوەكو

گەیشتە کۆتایی سورەتەکە، پاشان خوێندیەوە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ [البَقَرَة : ١٨٣]، هەتاوەکو گەیشتە ﴿عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾، [البَقَرَة : ١٨٥] .

پاشان ووتی : بەڕاستی ئەمڕۆ ڕۆژێکە کە دوعا تێیدا ڕەتناکرێتەوە بۆیە نیازەکانتان بەرز بکەنەوە بۆلای الله تعالى وە داوای پێویستییەکانتانی لێبکەن .

وە هەر دوو دەستی بەرزکردەوە لە گوێکانی تێنەدەپەڕین، پاشان دوعای کرد، پاشان شەش الله أکبری کرد بە ئیخلاص و تەواویەوە، حەوتەم جار ووتی الله أکبر على ما هدانا، پاشان ووتی : سوپاسی الله تعالى دەکەم وەکو چۆن سوپاسی خۆی کردووە لە کتابەکەی، چونکە بێگومان ئەو سوپاس و ستایشی خۆی کردووە لە هەشت شوێن لە حەوت سورەت .

جا یەکەم ئایەتی سورەتی الأنعام ی خوێندەوە وە کۆتا ئایەت لە سورەتی بني إسرائيل جا کاتێك خوێندیەوە ﴿وكَبِّرْهُ تَكْبِيراً﴾ [الإسراء : ١١١] دەنگی بەرز کردەوە پاشان ووتی الله أکبر لەسەر ئەوەی هیدایەتیداین، پاشان سەرەتای سورەتی الکهف ی خوێندەوە هەتاوەکو گەیشتە : ﴿مَّٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا﴾ [الكهف : ٣] .

پاشان ووتی : یا الله بمانگێڕە لەیەکێك لەوانە، پاشان ئەو ئایەتەی سورەتی النمل ی خوێندەوە ﴿قُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَىٰٓۗ ءَآللَّهُ خَيۡرٌ أَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾ **[النَّمْل : ٥٩]** .

پاشان ووتی : بەڵكو الله تعالی گەورەتر و بەرزترە، پاشان ئەو ئایەتی كۆتایی سورەتی النمل ی خوێندەوە ﴿وَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعۡرِفُونَهَاۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ﴾ **[النَّمْل : ٩٣]** .

پاشان یەكەم ئایەتی سورەتی سبأ و الملائكة ی خوێندەوە، پاشان خوێندیەوە ﴿فَلِلَّهِ ٱلۡحَمۡدُ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَرَبِّ ٱلۡأَرۡضِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ **[الجاثِية : ٣٦]** هەتاوەكو تەواویكرد .

پاشان ووتی : ئا بەو شێوەیە سوپاس و ستایشی خۆی كردووە جا سوپاس و ستایشی بكەن وەكو سوپاسی سوپاسكاران وە بەباشترین شێوە ستایشی بكەن، وە زۆر زیكر و یادی بكەن، زۆر زیكر و یادی بكەن .

پاشان هەر دوو دەستی بەرزكردەوە لە گوێكانی تێنەدەپەڕین، پاشان دوعای كرد، پاشان سوپاسی الله تعالی ی كرد و صەڵاواتیدا لەسەر پێغەمبەر وە دوعای كرد بۆ خەلیفەی ئیمانداران، پاشان دووبارە دەستی بەرز كردەوە و پاڕایەوە، پاشان سوپاسی الله تعالی ی كرد لەسەر ئەوەی كۆبوونەتەوە بۆی وە بۆ ئەوەی كۆبوونەتەوە بۆی، وە فرمانی پێكردن كەوا داوا بكەن بۆ دونیایان و دوارۆژیان، وە هەواڵی پێدان كەوا ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە كەوا پاڕانەوە

تێیدا ڕەتناکرێتەوە، ووتی : زیکر و یادی الله عزَّوَجَل بکەن ئەویش یادتان دەکات، پاشان دابەزی .

جا کاتێك ڕۆژی جەژنی قوربان هات هەمان شتی پێکردینەوە هاوشێوەی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان لە قورئان خوێندنەوەی ناو نوێژ و تەکبیرات وە ئەو حەمدەی کە کردی لە سەرەتای ووتارەکەی لە نوێژی جەژنی ڕەمەزان، پاشان شەش الله أکبری کرد بەگەورەیی و ئیخلاصەوە، الله أکبر الله أکبر، وە حەوتەم جار ووتی الله أکبر على ما هدانا پاشان ئەو ئایەتانەی خوێندەوە لە سورەتی الأنعام ﴿قُلۡ تَعَالَوۡاْ أَتۡلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمۡ عَلَيۡكُمۡۖ﴾ [**الأنعَام** : ١٥١]

هەتاوەکو گەیشتە ﴿سَنَجۡزِي ٱلَّذِينَ يَصۡدِفُونَ عَنۡ ءَايَٰتِنَا سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يَصۡدِفُونَ﴾ [**الأنعَام** : ١٥٧] .

پاشان شەش الله أکبری کرد بەئیخلاص و گەورەییەوە و حەوتەم جار ووتی الله أکبر على ما هدانا، پاشان کۆتاییەکانی سورەتی النحل ی خوێندەوە ﴿إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةٗ قَانِتٗا لِّلَّهِ حَنِيفٗا وَلَمۡ يَكُ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ [**النَّحۡل** : ١٢٠] هەتاوەکو سورەتەکەی تەواو کرد .

پاشان شەش الله أکبری کرد بە ئیخلاصی و ملکەچی و حەوتەم جار ووتی الله أکبر على ما هدانا، پاشان خوێندیەوە ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِي جَعَلَ فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجٗا﴾ [**الفُرۡقان** : ٦١] هەتاوەکو سورەتەکەی تەواو کرد، پاشان شەش الله أکبری کرد بە ئیخلاصی و حەوتەم جار ووتی الله أکبر على ما هدانا، پاشان

له سوڕەتی الحج ی خوێندەوە ﴿وَإِذۡ بَوَّأۡنَا لِإِبۡرَٰهِيمَ مَكَانَ ٱلۡبَيۡتِ أَن لَّا تُشۡرِكۡ بِي شَيۡـٔٗا﴾ [**الحَج : ٢٦**] هەتاوەکو گەیشتە ﴿فَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَا صَوَآفَّۖ﴾ [**الحَج : ٣٦**] ووتی : پاکی بۆ الله تعالی لە شیرك و خیانەت، هەتاوەکو گەیشتە ﴿وَبَشِّرِ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ [**الحَج : ٣٧**] پاشان خوێندیەوە ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ﴾ [**اللـيل : ١**] هەتاوەکو سوڕەتەکەی تەواو کرد،

پاشان ووتی : ئەمڕۆ ڕۆژی حەجی گەورەیە وە ئەو ڕۆژانە نۆ ڕۆژە زانراوەکەن کە الله عزَّوَجَل باسی کردوون لە قورئان، پاڕانەوە ڕەتناکرێتەوە تێیاندا وە ئەوە ڕۆژی حەجی گەورەیە وە دوای ئەو سێ ڕۆژە دیاریکراوەکەن کە الله عزَّوَجَل باسیکردوون لە قورئان، دوعا ڕەتناکرێتەوە تێیاندا بۆیە نیازەکانتان بەرز بکەنەوە بۆلای الله تعالی وە داوای پێویستییەکانتانی لێبکەن، جا هەر دوو دەستی بەرزکردەوە لە گوێکانی تێنەدەپەڕین، پاشان دوعای کرد .

پاشان شەش الله أکبری کرد بە ئیخلاصی، حەوتەم جار ووتی الله أکبر علی ما هدانا، پاشان باسی ئەو سوپاس و حەمدانەی کرد کە لە کۆتایی نوێژی جەژنی ڕەمەزان خوێندیەوە، سوپاس و ستایشی الله تعالی دەکەم وەکو چۆن سوپاس و ستایشی خۆی کردووە لە حەوت سوڕەت و لە هەشت ئایەت، هەتاوەکو تەواو بوو لە ووتارەکەی وەکو جەژنی ڕەمەزان بە گشتی.

١٢٩ - وه له معن ـهوه ووتى : ئيمامى مالك و ابن ابي ذئب ووتيان : (ئيمام له ڕۆژى جه‌ژن به ته‌كبيرات ده‌ست پێده‌كات كاتێك چووه سه‌ر مينبه‌ر) .

١٣٠ - وه له معن ـهوه ووتى : ٠ پرسيارم كرد له ئيمامى مالك : ئايا ئيمام ته‌كبيرات ده‌كات كاتێك له نێوان دوو وتاردانه‌كه دانيشت له نوێژى جه‌ژندا ؟

ووتى : وايده‌بينم ئه‌وه باش بێت) .

١٣١ - وه عبيد اللّٰه‌ى كوڕى عبد اللّٰه‌ى كوڕى عتبه‌ى كوڕى مسعود كه‌وا ووتى : (به‌ڕاستى ئيمام ته‌كبيرات ده‌كات له ڕۆژى جه‌ژنى ڕه‌مه‌زان و قوربان حه‌وت الله أكبر كاتێك داده‌نيشێت له‌سه‌ر مينبه‌ر پێش ووتاردان كاتێك هه‌ڵده‌ستێته‌وه دوعا ده‌كات يان ته‌كبيرات ده‌كات ئه‌وه‌ى به‌لايه‌وه چاك بوو) .

١٣٢ - وه له معن ـهوه ووتى : (پرسيار كرا له ئيمامى مالك له‌باره‌ى پياوێك نوێژ ده‌كات له‌گه‌ڵ ئيمام له ڕۆژى جه‌ژنى ڕه‌مه‌زان، ئايا بۆى هه‌يه بڕوات پێش ئه‌وه‌ى گوێ له ووتاره‌كه بگرێت ؟

ووتى : ناڕوات و ئه‌و شوێنه به جێناهێڵێت هه‌تاوه‌كو ئيمام ده‌ڕوات .

**١٣٣** - وه له معن ەوه ووتی : ئیمامی مالك ووتی : (هەرکەسێك الله أكبر ێکی نوێژی جەژن وازلێبهێنێ ئەوا دوو سوجدەی سەهو دەبات) .

**١٣٤** - وه له معن ەوه ووتی : (پرسیارکرا له ئیمامی مالك لەبارەی پیاوێك بینی کە خەڵکی تەواو بوونە لە نوێژی جەژن : کەوا هیچ کێشەیەکی تیا نەبینی لەنوێژکردن لە نوێژگە نەبێت یان لە ماڵەکەی نەبێت، وە ئەگەر نوێژی کرد لە نوێژگە یان لە ماڵەکەی خۆی هیچ کێشەیەکی تێدا نەبینی، وە حەوت الله أكبر دەکات لە ڕکاعەتی یەکەمدا پێش قورئان خوێندنەوە، وە پێنج الله أكبر دەکات لە ڕکعاتی دووەمدا پێش قورئان خوێندنەوە) .

**١٣٥** - وه له ولیده ەوه ووتی : (پرسیارم کرد لە ئیمامی مالکی کوڕی ئەنەس لەبارەی ئەوەی پیاوێك هاتووە بۆ نوێژی جەژن بەڵام بینی خەڵك تەواوبوونە لە نوێژ، وە ئیمامیش تەواو بووە لە وتار ووتی : دوو ڕکعات دەکات، پاشان ئەوە دەکات کە ئیمامەکەی کردی لە تەکبیراتی نوێژی جەژن) .

**١٣٦** - وه له ولیده وه ووتی : (پرسیارم کرد لە ئیمامی ئەوزاعی، پێم ووت : هاتم بۆ نوێژی جەژن بینیم ئیمام تەواو بووە لە نوێژ و ووتار دەدات .

جا ووتی : دانیشە بۆ ووتارەکەی، پاشان کە تەواو بوو لە ووتارەکەی هەستە و دوو ڕکعات بکە دەنگت بەرزمەکەرەوە لە خوێندنەوەت، وە تەکبیراتی نوێژی جەژن مەکە) .

**١٣٧** - لە عبد اللهی کوڕی مسعودەوە رضي الله عنه ووتی : (ئەوەی نوێژی جەژنی لەدەست چوو با چوار ڕکعات بکات) .

## بابی : (١١)

## دەربارەی کاتێك دوو جەژن كۆدەبنەوە لە ڕۆژێکدا



**١٣٨** - وە لە ئەبو هریرەوە رضي الله عنه، رسول الله ﷺ فەرمووی : (دوو جەژن کۆبووەتەوە بۆتان لەمڕۆدا، جا ئەوەی بیەوێ دەتوانێ جومعە نەکات، وە ئێمە کۆدەبینەوە بۆ نوێژی جومعە ان شاء الله) .

**١٣٩** - وە لە عبد العزيزی کوڕی رفيع ەوە ووتی : (پرسیارم کرد لە خەڵکی مەدینە ووتم : رسول الله ﷺ دە ساڵ لەناو مەدینەدا بوو ئایا هیچ جارێك دوو جەژن کۆنەبووەتەوە لە ڕۆژێکدا ووتیان : بەڵێ .

هەستاوە و سوپاس و ستایشی الله عزَّوَجَل ی کرد و ووتی : بێگومان دوو جەژنتان بۆ کۆبووەتەوە وە بێگومان خێرتان پێکاوە و ئێمە نوێژی هەینی دەکەین، جا ئەوەی پێی خۆشە لەگەڵمان بێت بابێت، وە ئەوەشی پێی خۆشە دابنیشێت ئەوا با دابنیشێت) .

**١٤٠** - له جەعفەری كوڕی محمدەوە، له باوكیەوە ووتی : (دوو جەژن كۆبوویەوە لەسەردەمی ئیمامی علي رضي الله عنه جا فەرمووی : بەڕاستی ئەمڕۆ دوو جەژن كۆبووەتەوە لە ڕۆژێكدا، جا ئەوەی پێی خۆشە جومعە بكات لەگەڵمان با بیكات، وە ئەوەی دەیەوێ بڕوات ئەوا مۆڵەتی بۆ هەیە) .

**١٤١** - وە له عطاء وە ووتی : (ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و ڕۆژی هەینی كۆبوویەوە له سەردەمی عبد اللّهی كوڕی الزبير رضي الله عنهما جا دوو ڕكعاتی كرد، جا ئەوە باسكرا بۆ عبد اللّهی كوڕی عباس رضي الله عنهما ووتی : پێكاویەتی) .

**١٤٢** - وە ئیبراهیمی كوڕی عقبەوە ووتی : (بیستم عمر ی كوڕی عبد العزیز ووتاری دەدا لەڕۆژێكدا كە دوو جەژن كۆبووەوە تێیدا جا ووتی : ئا بەم شێوەیە دوو جەژن كۆبووەیەوە لەسەردەمی رسول الله جا رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەوەی لە خەڵكی دەورووبەرە پێی خۆشە ئامادەی نوێژی جومعە بێت با ئامادەبێت، وە ئەوەی دادەنیشێت **[واتە نایێت بۆ نوێژی جومعە]**، با دابنیشێت هیچی لەسەر نییە) .

## بابی : (١٢)

## ئەوەی ڕیوایەتکراوە کەوا نوێژی سوننەت نییە پێشی نوێژی جەژن و پاشی نوێژی جەژن لە ڕۆژی جەژندا



**١٤٣** - وە لە عبد اللهی کوڕی عباسەوە رضي الله عنهما کە وا : (رسول الله ﷺ دەرچوو ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان یان قوربان جا دوو ڕکعات نوێژی کرد، نوێژی نەکرد نە لەپێشیان وە نە لە پاشیان، پاشان هات بۆلای ئافرەتەکان و بیلالیش رضي الله عنه لەگەڵی بوو جا فەرمانی پێکردن بە خێرکردن، جا ئافرەتی واهەبوو بازنەکەی دەبەخشی و هەبوو ملوانکەکەی) .

**١٤٤** - وە لە عبد اللهی کوڕی عباسەوە رضي الله عنهما کەوا : (رسول الله ﷺ دەرچوو ڕۆژی جەژن جا دوو ڕکعات نوێژی کرد، نوێژی نەکرد نە لەپێشیان وە نە لە پاشیان، پاشان هات بۆلای ئافرەتەکان و فەرمانی پێکردن بە خێرکردن، جا ئافرەتی واهەبوو بازنەکەی دەبەخشی و هەبوو ملوانکەکەی) .

**١٤٥** - وه له عبد اللهى كوڕى عباسهوه رضي الله عنهما كهوا : (رسول الله ﷺ دهرچوو ڕۆژى جهژنى قوربان جا دوو ڕكعات نوێژى كرد، نوێژى نهكرد نه لهپێشيان وه نه له پاشيان) .

**١٤٦** - وه له نافعهوه له عبد اللهى كوڕى عمر ـهوه رضي الله عنهما : (ڕۆژى جهژنى ڕهمهزان نوێژى سوننهتى نهدهكرد نه لهپێشى نه لهپاشى نوێژى جهژن).

**١٤٧** - وه له نافعهوه له عبد اللهى كوڕى عمر ـهوه رضي الله عنهما كهوا (ئهو نوێژى سوننهتى نهدهكرد له ڕۆژى جهژن نه لهپێشى نه لهپاشى نوێژى جهژن ههتاوهكو خۆرئاوا دهبێت) .

**١٤٨** - وه له نافعهوه كهوا : (عبد اللهى كوڕى عمر رضي الله عنهما خۆى دهشۆرد بۆ نوێژى ههردوو جهژنهكه وه دهردهچوو بۆ نوێژ پێش ئهوهى نان بخوات، وه نوێژى سوننهتى نهدهكرد نه لهپێشى نه لهپاشى نوێژى جهژن) .

**١٤٩** - وه له نافعهوه كهوا : (عبد اللهى كوڕى عمر رضي الله عنهما ڕۆژى جهژنى ڕهمهزان نوێژى سوننهتى نهدهكرد پێش ئهوهى له ماڵ دهربچێت بۆ نوێژگه وه نه دواى ئهوهى دهگهڕايهوه ههتاوهكو خۆرهكه دهگۆڕێت، وه خۆى دهشۆرد و بۆنى خۆشى له خۆيدهدا له ڕۆژى جهژنى ڕهمهزان) .

**١٥٠** - وه له ابن شهابەوه له بارەی نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان ووتی : (بانگ و قامەتی تێدا نییە) .

**١٥١** - وه له ابن شهابەوه ووتی : (پێمان نەگەیشتووه كەوا هیچ یەكێك له هاوەڵانی رسول الله ﷺ له ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان تەسبیحاتی كردبێت نه پێش نوێژی جەژن نه پاشی نوێژی جەژن، ئیللا مەگەر بەلای مزگەوتی رسول الله ﷺ تێپەڕیبن **[وەستاون]** بۆ تەسبیحات كردن) .

**١٥٢** - وه له عمروی كوڕی شعیب ەوه، له باوكییەوه، له باپیرییەوه ووتی : رسول الله ﷺ فەرمووی : (نوێژی جەژن نوێژی سوننەت نییە نه له پێشی نه له پاشی) .

**١٥٣** - وه له عمر ی كوڕی عبد العزیزەوه كەوا (ئەو تەسبیحاتی نەدەكرد پێش نوێژی دوو جەژنەكه وه نەله پاش نوێژەكان، وه تەكبیراتی دەكرد لەكاتی دەرچوون بۆ وتار و نوێژەكه بۆ ئەوەی كەس نوێژ نەكات له پێشیانەوه) .

**١٥٤** - وه له سعدی كوڕی ئیسحاقەوه ووتی : (نوێژی جەژنم كرد، پاشان ڕۆیشتم دەمویست بچم بۆ مزگەوت، جا مامم پێی ووتم : دەتەوێت بۆ كوێ بچیت؟

جا ووتم : دەمەوێت بچم بۆ مزگەوت .

جا ووتی : ئەی کوڕی برام، بەڕاستی لەمرۆدا نوێژ نییە جگە لەو دوو ڕكعاتەكە نەبێت بێجگە لە نوێژە فەڕزەكان) .

**١٥٥** - وە لە سەعدی كوڕی ئیسحاقەوە، لە باوكییەوە، لە باپیریەوە كعبی كوڕی عجرة رضي الله عنه فەرمووی : (بە باپیرم ووت دوای ئەوەی كە ئیمام لە نوێژی جەژن تەواو بوو : ئایا نەچین بۆ مزگەوت وەكو چۆن خەڵكی دەڕۆن بۆ مزگەوت؟

جا ووتی : ڕۆڵەكەم، ئەو دوو ڕكعاتە نوێژە بەسن بۆ تسبیحاتی ئەمڕۆمان) .

**١٥٦** - وە لە عبد الملكی كوڕی كعبی كوڕی عجره ووتی : (ئامادەی یەكێك لە نوێژی دوو جەژنەكە بووم لەگەڵ كعب رضي الله عنه، ووتی : جا كاتێك نوێژ تەواوبوو زۆرێك لە خەڵكی ڕۆیشتن بۆ مزگەوت، بەڵام ئەوم بینی دەچوو بۆماڵەوە، ووتم : باوكە، ئایا ناڕۆی بۆ مزگەوت، چونكە من خەڵكی دەبینم بۆ ئەوێ دەچن، ووتی : بێگومان زۆرێك لەوانەی دەیانبینی نەزان و كەم عیلمن، بەڕاستی ئەو دوو ڕكعاتەی كردمان تەسبیحاتی ئەمڕۆمانە هەتاوەكو بۆ نوێژ بانگ دەكرێیت) .

**١٥٧** - وه له يزيدى كورِى ئەبو عبيدەوه ووتى : (رِۆژى جەژن دەرچووم بۆ ئەوەى هاوەڵێتى سلَمَة كورِى الأكوع رضي الله عنه بكەم، جا ئامادەى نوێژى بەيانى بوو لەگەڵ ئيمام له مزگەوتى رسول الله ﷺ، پاشان دەرچووين بۆ نوێژگه، پاشان گەڕاينەوه ماڵەكانمان، وه نه گەڕاينەوه بۆ مزگەوت) .

**١٥٨** - وه له يەزيدى كورِى أبو عبيدەوه كەوا : (دەرچوو لەگەڵ سَلَمَة ى كورِى الأكوع رضي الله عنه له رِۆژى جەژنى ڕەمەزان يان قوربان، ووتى : من و ئەو ئامادەى نوێژى بەيانى بووين، پاشان چووين بۆ نوێژگه و نوێژمان كرد لەگەڵ ئيمام، پاشان سَلَمَة رضي الله عنه گەڕايەوه بۆ ماڵەوه، وه نەگەڕايەوه بۆ مزگەوت هەتاوەكو ڕۆيشتين بۆ نوێژى نيوەڕۆ) .

**١٥٩** - وه له ئەنەسى كورِى عياض ەوه ووتى، يەزيدى كورِى أبو عبيدەوه ووتى : (سەلەمه رضي الله عنه ئامادەى نوێژى بەيانى بوو له رِۆژى جەژنى ڕەمەزان وه منيش لەگەڵى بووم، پاشان ڕۆيشت بۆ نوێژگه، جا مايەوه هەتاوەكو ئيمام هات، پاشان ڕۆيشت و نەگەڕايەوه بۆ مزگەوت هەتاوەكو ڕۆيشت بۆ نوێژى نيوەڕۆ) .

**١٦٠** - وه له يەزيدى كورِى ئەبو عوبەيدەوه ووتى : (نوێژى بەيانيم كرد لەگەڵ سَلَمَة ى كورِى الأكوع له مزگەوتى رسول الله ﷺ، پاشان ڕۆيشت منيش ڕۆيشتم لەگەڵى هەتاوەكو گەيشتينه نوێژگه، جا دانيشت و منيش

دانیشتم لەگەڵی هەتاوەكو ئیمام هات، جا نوێژی كرد و هیچ نوێژێكی تری نەكرد نەلە پێشی نەلە پاشی، پاشان گەڕایەوە ماڵەوە) .

**١٦١** - وە لە هیشامی كوڕی عورەوە، لە باوكییەوە كەوا : (ڕۆژی جەژن دەردەچوو بۆ نوێژ جا منیش دەڕۆیشتم لەگەڵی جا دەهات بۆ مزگەوتی رسول الله ﷺ جا دەستی دەكرد بە نوێژ تێیدا، پاشان دەردەچوو نوێژی نەدەكرد نەلە پێشی نەلە پاشی هەتاوەكو دەهات بۆ مزگەوت جا كۆتایی پێدەهێنا) .

**١٦٢** - وە لە هیشامی كوڕی عورەوە ووتی : (باوكم دەردەچوو لە ماڵ لە ڕۆژی جەژن جا تێدەپەڕی بەلای مزگەوتی رسول الله ﷺ نوێژی تێدا دەكرد، پاشان دەهات بۆ نوێژگە بەڵام نوێژی تێدا نەدەكرد، جا كاتێك عوروە نوێژی جەژنی دەكرد دەگەڕایەوە جا نوێژی دەكرد لە مزگەوتی رسول الله ﷺ بەو دەستی پێدەكرد، وە بەویش كۆتایی پێدەهێنا، پاشان دەگەڕایەوە ماڵەوە، وە لە هیچ كەسێكەوە نەزاندراوە نوێژ بكرێ لە نوێژگەی رسول الله ﷺ) .

**١٦٣** - وە لە هیشامەوە ووتی : (كەوا باوكم كاتێك دەچوو بۆ نوێژگە، جا بەهەمان شێوە گێڕایەوە، وە ووتی : وە هیچ كەسێك نەبووە حەز بكات كەوا نوێژ بكات لە نوێژگەی رسول الله ﷺ پێش نوێژی جەژن و پاشی نوێژەكە) .

**١٦٤** - وه‌ له‌ إسماعيل ‌ه‌وه‌، له‌ الشعبي يه‌وه‌، ووتی : (ده‌رچووین له‌گه‌ڵی له‌ ڕۆژی جه‌ژندا بۆ جوبانه‌، نوێژی نه‌كرد له‌ پێشی نه‌له‌ پاشی نوێژی جه‌ژن .

وه‌ پیاوێكمان له‌گه‌ڵ بوو له‌ الحيِّ، جا هه‌ستا بۆ ئه‌وه‌ی نوێژ بكات، عامر به‌توندی ڕێگری لێكرد) .

**١٦٥** - وه‌ له‌ نافع ‌ه‌وه‌ ووتی : (عبد اللّٰهی كوڕی عمر رضي الله عنهما نوێژی نه‌ده‌كرد نه‌له‌ پێش نه‌له‌ پاش نوێژی جه‌ژن) .

**١٦٦** - وه‌ له‌ عامره‌وه‌ ووتی : (نوێژی جه‌ژنم كرد له‌گه‌ڵ شریح جا نوێژی نه‌كرد له‌ پێشی نه‌له‌ پاشی، وه‌ هاتم بۆ مه‌دینه‌ و ئه‌وان كۆده‌نگ بوون، جا هیچ یه‌كێكم نه‌دیت له‌ فه‌قیهه‌كان نوێژ بكه‌ن نه‌ له‌ پێشی نه‌ له‌ پاشی) .

**١٦٧** - وه‌ له‌ عامره‌وه‌ ووتی : (له‌ ته‌نیشت شریح بووم له‌ ڕۆژی جه‌ژن، جا نه‌مبینی نوێژ بكات له‌ پێشی نه‌له‌ پاشی، وه‌ هاتم بۆ مه‌دینه‌ و ئه‌وان كۆده‌نگ بوون، ووتی : وه‌ه‌ هاتم بۆ مه‌دینه‌ جا هیچ یه‌كێكم نه‌دیت له‌ فه‌قیهه‌كان نوێژ بكه‌ن له‌پێشی نه‌ له‌ پاشی) .

**١٦٨** - وه‌ له‌ سَلَمَة ی كوڕی نبیط ‌ه‌وه‌ ووتی : (من و ضحاك نوێژمان كرد له‌ ڕۆژی جه‌ژن، جا كاتێك خه‌ڵكی ڕۆیشتن، ئه‌ویش ڕۆیشت، ووتی ووتم : ئایان نوێژ ناكه‌یت؟

ووتی : نوێژ نییه له پێش و پاشی نوێژی جه‌ژن) .

**١٦٩** - وه له سلیماني ته‌یمییه‌وه ووتی : (ئه‌نه‌سی کوڕی مالك و جابری کوڕی زید و صفوان ی کوڕی محرز و سه‌عیدی کوڕی ئه‌بو الحسن م بینی نوێژیان ده‌کرد پێش ده‌رچوونی ئیمام له ڕۆژی جه‌ژن .

**١٧٠** - وه له إبراهیم ‌ه‌وه ووتی : نوێژ نییه پێش ده‌رچوونی ئیمام بۆ نوێژ .

اللَّهُمْ اجْعَلْ عَمَلِي كُلَّهُ صَالِحَاً وَاجْعَلْهُ لِوَجْهِكَ خَالِصَاً وَلا تَجْعَلْ لِأَحَدٍ فِيهِ شَيْئَاً
والحمدلله حق حمده وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم .

https://t.me/KitabSalaff

# پێڕست